زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# مووسا پێغەمبەر

سەلامی خوای لێبێت





زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# مووسا پێغەمبەر

سەلامی خوای لێبێت

بسم الله الرحمن الرحيم

**ناوی نامیلکە:** مووسا پێغەمبەر
(سەلامی خوای لێبێت)
**ئامادەکردنی:** محمد عەلی قەرەداغی
**چاپ و دیزاین:** ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
**تیراژ:** ( ٢٠٠٠) دانە
**نرخ:** ( ١٥٠٠) دینار
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٧٦٧) ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە.

ARA Media Center
ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

دوای چوونی یەعقووب (عليه السلام) بۆ میصرو
نیشتەجێبوونی خۆی و نەوەکانی لەوێدا بە
بەنوئیسرائیل ناوبانگیان دەرکرد. ماوەیەکی زۆر
لەو وڵاتەدا ژیان و خوداپەرستییان دەکردو
خەڵکەکە لەگەڵیاندا بە بەختەوەریی دەژیان.
ماوەیەك دوای ئەوە پاشایەکی ستەمکار بەناوی
فیرعەون پەیدا بوو، خەڵکی دەچەوساندەوەو
کۆیلەکاریی پێ دەکردن. شەوێك فیرعەون
لەخەویدا بینیی لە بەنوئیسرائیلدا کوڕێك
لەدایك دەبێ، ئەو کوڕە دەست بەسەر
وڵاتەکەیدا دەگرێت و فیرعەون بەدەستی ئەو
تێدا دەچێت. بۆیە بڕیاریدا: هەرچی نێرینەیەك لە
بەنو ئیسرائیل لەدایك دەبێ هەموویان بکوژن.



لەناو بەنو ئیسرائیلییەکاندا پیاوێکی هەژار هەبوو ناوی عیمران بوو. ژنەکەی دووگیان بوو، کە منداڵەکەی بوو کوڕێك بوو ناوی نا (مووسا عليه السلام)، ترسا دەستەو دایەرەی فیرعەون بیکوژن، خودا وەحی بۆ نارد کە: شیری بداتێ و، بیخاتە سنووقێکەوەو سنووقەکە فڕێ بداتە ناو دەریای نیل. ئاوی نیل سنووقەکەی برد تا گەیاندیە کۆشکی فیرعەون. پاسەوانانی کۆشك سنووقەکەیان دەرهێنا، کە کردیانەوە ئەو کوڕەی تێدابوو. ئاسیەی خێزانی فیرعەون چاوی بە مووسا کەوت خۆشی ویست، بە سەربازەکانی گوت: مەیکوژن. فیرعەونیشی ڕازی کرد کە سەری نەبڕێ و



ئاسیە گەڕا بۆ دایەنێك شیر بدا بە مووسا، بەڵام هەر ژنێکیان ئەهێنا مووسا عليه السلام مەمکەکەی نەدەگرت. خوشکەکەی مووسا لە نزیکیەوە چاودێریی ئەم بەسەرهاتەی دەرکرد. بە ئاسیەی وت: ئافرەتێکی پاك و خاوێن هەیە بەڵکو بتوانێ دایەنیی ئەم منداڵە بکات، کە ژنەکەیان هێنا مووسا عليه السلام مەمکەکەی مژیی و تا تێری نەخوارد بەری نەدا. ئەو ئافرەتە بەسۆزە دایکی مووسا بوو.



مووسا عليه السلام لە کۆشکی فیرعەوندا گەورە بوو، پلەو پایەیەکی دیاری هەبوو، مووسا عليه السلام باوەڕی بەخودا هەبوو، بۆیە فیرعەون ڕقی لە خۆی و لە تیرەکەیشی بوو کە بەنی ئیسرائیلییەکان بوون. ڕۆژێك مووسا عليه السلام بینی یەکێك لە دەستەو دایەرەی فیرعەون لە زەلامێکی بەنی ئیسرائیلیی ئەدا، مووسا عليه السلام سیخورمەیەکی دا لە کابرای دەستدرێژیکەرو کوشتی.

خەڵکی میصر بیستیان بە دەستی مووسا پیاوێکی میصریی کوژراوە بڕیاریان دا تۆڵەی لێ بکەنەوەو بیکوژن. پیاوێکی دڵسۆز بەو بڕیارەی زانی هات بۆ لای مووساو پێی وت: خەڵك بڕیاریان داوە بتکوژن، فریای خۆت کەوە! مووسا عليه السلام بە قسەی کردو چوو بۆ شاری مەدیەن لە نزیکی شام.



لە ڕێگەدا بینی خەڵك لەسەر بیرێك خڕبوونەتەوە ئاژەڵ ئاو دەدەن. بینی لەولایشەوە دوو کچ وەستاون. وتی: ئەوە چیتانە؟ وتیان: کەسمان نیە باوکێکی پیرمان هەیە. دەبێ چاوەڕوان بین تا خەڵکەکە ئاژەڵی خۆیان ئاو دەدەن ئەوسا ئێمە ئاوی ئاژەڵی خۆمان بدەین. مووسا عليه السلام ئاژەڵەکەی بۆ ئاودان و لەبن دارێکدا دانیشت.



کچەکان ئەمەیان بۆ باوکیان گێڕایەوە، ئەویش یەکی لە کچەکانی نارد بە شوێن مووسادا تا پاداشتی ئەو کارەی بداتەوە. کاتێ مووسا (عليه السلام) هات و بەسەرهاتەکەی بۆ پیاوە پیرەکە گێڕایەوەو پیاوە پیرەکەیش پیاوی چاك بوو وتی: مەترسە لە ستەمکاران ڕزگارت بوو. دوایی بە مووسای وت: ئەگەر هەشت ساڵ ڕەنجبەریم بکەیت یەکێك لەم کچانەمت لێ مارە دەکەم و، لەسەر ئەوە ڕێکەوتن.



دوای تەواوبوونی ئەو ماوەیە مووسا عليه السلام بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ میصر. لەگەڵ خێزانەکەیدا بەڕێکەوتن. لە ڕێگەدا لای کێوی (طوور) لە (سینا) ئاگرێکی بینی. کە مووسا چوو بۆلای ئاگرەکە، خودای پەروەردگار بانگی لێ کرد: تۆم کردوە بە پێغەمبەر، بڕۆ بۆ لای فیرعەون و بانگی بکە بۆ خوداناسیی.

فیرعەونیش خۆی بەخودا دەزانی. کە مووسا عليه السلام چووەلای و ئەوەی پێ وت، بەتوندیی بەرەنگاری بوەوەو داوای موعجیزەی لە مووسا کرد.

مووسا عليه السلام عەساکەی دەستی فڕێدا بوو بە مارێکی گەورە، دەستی لە باخەڵی دەرهێنا ئەوەندە سپیی و جوان بوو ورشەی دەهات.



فیرعەون بە مووسای وت: تۆ
جادووگەریت و، جادووگەرەکانی
خۆی لە هەموو لایەکەوە
کۆکردەوە. خودای پەروەردگار
مووسای بەسەر جادووگەرەکاندا
سەرخست. جادووگەرەکان هەموو
باوەڕیان بەخودا هێنا، فیرعەون
هەموویانی کوشت.



که فیرعەون سزادانی بەنوئیسرائیلییەکانی زیاد کرد، مووسا (علیه السلام) لە میصر دەری کردن و لەگەڵ خۆی بردنی. فیرعەون و سوپاکەی کەوتنە شوێنیان، کە گەیشتنە دەریاکە خودای پەروەردگار فیرعەون و سوپاکەی خنکاندو مووساو تاقمەکەیشی بەبێ زیان لە دەریاکە ڕزگارکرد و پەڕینەوە.

